زنجیرەی ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست
(٧٦)

# سورەتی




- پلە وپایە و پێگەکەی .
- حوکمی خوێندنەوەی لە ناو نوێژدا .
- تەفسیری ئایەتەکانی .
- ئەو سوودانەی کە لێی دەردەهێنرێن .

نووسینی
زانا و پێشەوا / صالح بن فوزان الفوزان ( حفظه الله )
ئەندامی دەستەی گەورە زانایان و ئەندامی لیژنەی هەمیشەیی فەتوا

وەرگێڕانی
مامۆستا محمد عبد الرحمن لطیف کەلاری

زنجیرەی ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست
( ٧٦ )

# سورەتی فاتیحە

١ ـ پلەوپایە و پێگەی .
٢ ـ حوکمی خوێندنەوەی لە نوێژدا .
٣ ـ ناوەکانی سورەتی فاتیحە .
٤ ـ ژمارەی ئایەتەکانی .
٥ ـ لێکدانەوەی پەناگرتن و ( بسم الله )کردن .
٦ ـ تەفسیری ئایەتەکانی فاتیحە .
٧ ـ ئەوەی کە هاتووە لە بارەی فەزڵیەوە .
٨ ـ ئەو سوودانەی کە لێی دەردەهێنرێن .

نووسینی زانا و پێشەوا
صالــح بن فوزان الفوزان حفظه الله
ئەندامی دەستەی گەورە زانایان و ئەندامی لیجنەی هەمیشەیی فەتوا

وەرگێڕانی
مامۆستا محمد عبد الرحمن لطيف کەلاری
پێداچونەوەی زانا و بانگخواز
مامۆستا عبداللطيف أحمد

چاپی پێنجەم
١٤٣٦ ك

فهرسة مكتبة الـملك فهد الوطنية أثناء النشر

عنوان الكتـاب : (**تەفسیری سورەتی فاتیحە / تفسير سورة الفاتحة**) .

الـمؤلف : الإمام العلامة الشيخ صالـح الفوزان حفظه الله .

الـمترجم : أبو فردوس محمد بن عبدالرحمن بن لطيف الكردي العراقي .

ردمك :

رقم الإيداع :

١ ـ التفسير ٢ ـ الفقه

**ناوی نامیلکە: تەفسیری سورەتی فاتیحە** .

**ناوی نووسەر :** الإمام العلامة الشيخ صالـح الفوزان حفظه الله .

**ناوی وەرگێڕ :** مـحمد عبد الرحمن لطيف .

**زنجیرە : زنجیرەی ( ٧٦ ) لە ( زنجیرەی پەروەردە و بانگەواز) .**

**ژمارەی سپاردن : ژمارە (٥٠٣)ی وەزارەتی ڕۆشنبیری حوکومەتی هەرێمی کوردستانی پێدراوە .**

**نۆرەی چاپ : پێنجەم .**

**ساڵی چاپ : ١٤٣٦ك ـ ٢٠١٥ .**

بسم الله الرحمن الرحيم

## * پێشەکی وەرگێڕ :

الْحَمْدُ للّه رَبِّ الْعَالَمِينَ ، وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ، وَصَلَّى اللهُ وَسَلَّمَ عَلَى عَبْدِهِ وَرَسُوْلِهِ نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَأَصْحَابِهِ أَجْمَعِيْنَ .
أَمَّا بَعْدُ :

ئەمە تەفسیرێکی کورت و پوخت و تێروتەسەلی گەورەترین سورەتی قورئانی پیرۆزە کە بریتی‌یە لە : (سورة الفاتحة) کە لە لایەن زانای گەورە و پێشەوا (الشيخ صالح الفوزان)ەوە ئامادەکراوە .

بەشێك لە گرنگی ئەم سورەتە ئەوەیە کە خوای پایەدار خوێندنەوەیی واجب و پێویست کردووە لە نێو هەموو رکعاتێکی نوێژدا .

ئەمەش وا دەخوازێت کە پێویستە مرۆڤی موسڵمان ئاشنابێت بە تەفسیر و واتاکەی بە شێوازێکی پوخت و رێکوپێك بۆ ئەوەی بزانێت لە ناو نوێژەکەیدا چی دەخوێنێت .

بۆیە بە پێویستم زانی وەریبگێڕمە سەر زمانی کوردی ، داواکارم لە خوای گەورە کەوا سوودی پێبگەیەنێت بە موسڵمانان ، وە لێمی قەبوڵ بکات ، بەڕاستی خوا بەخشندە و میهرەبانە .

باوکی فردوس محمد عبدالرحمن لطيف

مەککەی پیرۆز / نزیك ماڵی خوا

# سورەتی فاتیحە

## ١ـ پلەوپایە و پێگەی سورەتی فاتیحە :

ئەم سورەتە پلەوپایەیەکی گەورەی هەیە لە نێو قورئانـدا ، چـونکە گەورەترین سورەتە تێیدا ، هەروەکو چۆن گـەورەترین ئایـەتی قورئـان بریتی‌یـە لـە (آيَــةُ الكُرسِــــي) ، وە لەبـەر گرنگـی ئـەم سـورەتە لـە سـەرەتای قورئانـدا نووسـراوە ، وە هـەر لەبـەر ئەمـەش نـاونراوە بـە (فاتــحة الكتاب / دەروازەی کتێبی خوا) ، وە ئەمەش بەڵگەیە لەسـەر گرنگی و پلەوپایەی ئەم سورەتە ، چونکە پێشنەخراوە و نـەکراوە بـە یەکەمین سورەت لە قورئاندا ئیللا لەبەر گرنگیەکەی نەبێت .

## ٢ـ حوکمی خوێندنەوەی لە نوێژدا :

هەروەها بەشێك لە گرنگی ئـەم سـورەتە ئەوەیـە کـە خـوای پـاك و بێگەرد و پایەدار خوێندنەوەیی واجب و پێویست کردووە لە نێو هەموو رکعاتێکی نوێژدا .

وە زۆربەی زانایان بۆ ئەوە رۆیشتوون کـە خوێندنـەوەی سـورەتی فاتیحە لە نوێژدا واجبە ، وە هەرکەسێك نەیخوێنێت لە نوێژەکەیدا ئەوا نوێژەکەی ڕاست و دروست نـی‌یـە لەبـەر فەرمایـشتی پێغەمبـەر (ﷺ) : ((لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَــابِ))[1] واتە : نوێــژی ئەو کـەسە دروست نی‌یە کە سورەتی فاتیحەی تێدا نەخوێنێت .

---

[1] متفق عليه من حديث عبادة بن الصامت : البخاري : كتاب الأذان ، باب (٩٥) ، رقم : (٧٥٦) ، [٢ / ٣٠٦] ، ومسلم : كتاب الصلاة رقم : (٣٩٤) .

ئەمــەش بــۆ كەســێكە كــە بتوانێــت بیخوێنێــت ، بــەڵام كەســی دەستەوەستان كە ناتوانێت بیخوێنێت لەبەر دەستەوەستانبوونی لە لەبەركردنی ئەوا ئەم كەسە ئەوە دەخوێنێت كە بۆی ئاسانە لە ئایەتەكانی تری قورئان جگە لە سورەتی فاتیحە ، وە ئەگەر هاتوو هیچ شتێكی لە قورئان نەزانی ئەوا ئەم زیكرە دەخوێنێت : (سُبْحَانَ اللَّه ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّــه) لەبەر فەرمایشتی پێغەمبەر (ﷺ) : ((إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلاَةِ فَكَبِّرْ ، فَــإِنْ كَانَ مَعَكَ قُرْآنٌ فَاقْرَأْ وَإِلاَّ فَاحْمَدِ اللَّهَ وَكَبِّرْهُ وَهَلِّلْهُ ثُمَّ ارْكَعْ ...))[٢].

واتە : ئەگەر هەستایت بۆ نوێژ ئەوا بڵێ : (اللَّهُ أَكْبَــر) ، وە ئەگەر شتێكت لە قورئان لەبەر بوو ئەوا بیخوێنە ئەگینا سوپاسی خوا بكە و بە گەورەی دەربڕە و یەكخواپەرستی ڕاگەیەنە و ئەنجا كڕنوش بەرە .

وە زۆربەی زانایان بۆ ئەوە ڕۆیشتوون كە خوێندنەوەی سورەتی فاتیحە واجبە لەسەر پێشنوێژ و ئەو كەسەی كە بە تەنها نوێژ دەكات (الإمام والـــمنفرد) ، وە سەبارەت بە خوێندنەوەی لە ئاست ئەو كەسەی كە لە پشت پێشنوێژەوەیە (الـــمأموم) ئەوا جیاوازن بەسەر سێ وتە و بۆچووندا :

وتەی یەكەم : خوێندنی سورەتی فاتیحە واجبە لەسەر هەموو نوێژگەرێك : پێشنوێژ بێت (الإمـــام) یان لە پشت پێشنوێژەوە بێت

---

[٢] اخرجه من حديث رفاعة بن رافع : أبو داود : كتاب الصلاة ، بــاب (١٤٨) ، رقــم (٨٦١) ، [١ / ٣٧٧] ، والترمذي : كتاب الصلاة ، باب (١١٠) ، رقم (٣٠٢) ، [٢ / ١٠٠] .

(الـــمأموم) يـان بـه تـاك نوێـژ بكـات (الــــمنفرد) لەبـەر فەرمایـشتی پێغەمبەر (ﷺ) : ((لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ)) .

واتە : نوێژی ئەو كەسە دروست نی‌یە كـە سـورەتی فاتیحـەی تێـدا نەخوێنێت .

وە ئەمەش گشتگیرە بـۆ هـەموو نوێژگـەرێك ، هـەروەها پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی : ((لَعَلَّكُمْ تَقْرَءُونَ خَلْفَ إِمَامِكُمْ ؟ قُلْنَا : نَعَمْ هَــذَا يَــا رَسُولَ اللَّهِ ، قَالَ : لاَ تَفْعَلُوا إِلاَّ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ ، فَإِنَّهُ لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لَمْ يَقْــرَأْ بِهَا))[٣] .

واتــە : وادیـارە لـە پـشت پێـشنوێژ (ئیمـام)ەكەتانـەوە قورئـان دەخوێنن ؟ وتمان : بەڵێ بە خێرایی ئەی پێغەمبەری خوا ، فەرمووی : كاری وا مەكەن جگە لـە سـورەتی فاتیحـە نـەبێت چـونكە نوێـژی ئـەو كەسە دروست نی‌یە كە سورەتی فاتیحەی تێدا نەخوێنێت .

وە ئەمەش مەزهەبی ئیمامی شافعی و كۆمەڵێك لە فەرموودەناسانە وەك ئیمامی بوخاری و جگە لە ئەویش ، بۆچوونیان وایە كە : خوێندنی سورەتی فاتیحە واجبە لەسەر : پێشنوێژ (الإمام) و ئەو كەسەش كە لە پـشت پێشنوێژەوەیە (الـــمأموم) و ئـەو كەسـەش كـە بـە تـەنها نوێـژ دەكات (الــــمنفرد) .

[٣] أخرجه بنحوه من حديث عبادة بن الصامت : أبو داود : كتاب الصلاة ، باب (١٣٦) ، رقم (٨٢٤) ، [١ / ٣٦٢] ، والنسائي : كتاب الافتتاح ، باب (٢٩) ، رقم (٩١٩) ، [١ / ٤٧٩] .

وتەی دووەم : خوێندنی سورەتی فاتیحە واجب نیە لەسەر ئەو کەسەی کە لە پشت پێشنوێژەوەیە (الـــمأموم) چونکە خوێندنی پێشنوێژ (الإمام) لە بری ئەویشە و لەسەری دەیخات لەبەر فەرمایشتی پێغەمبەر (ﷺ) : ((مَنْ كَانَ لَهُ إِمَامٌ فَقِرَاءَةُ الإِمَامِ لَهُ قِرَاءَةٌ))[٤].

واتە : هەرکەسێك پێشنوێژی (ئیمامی) هەبوو ئەوا خوێندنی پێشنوێژ (ئیمام) خوێندنیشە بۆ ئەو .

بەڵام ئەم فەرموودەیە قسە هەیە لەسەر سەنەدەکەی .

وە ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەشیان کردووە بە بەڵگە : ﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾ ﴾ [الأعراف] .

واتە : وە ئەگەر قورئان خوێنرا ئەوا گوێی بۆ بگرن و بێدەنگ بن بەڵکو خوا رەحمتان پێبکات .

لە رووی بەڵگەهێنانەوە وتویانە : خوای گەورە فەرمانی کردووە بە گوێگرتن و بێدەنگبوون بۆ خوێندنەوەی قورئان ، وە ئەم ئایەتە سەبارەت بە گوێگرتن لە نوێژدا دابەزیوە ، واتە : ئەگەر پێشنوێژ (ئیمام) قورئانی خوێند ئەوا پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە لە پشت پێشنوێژەوەیە (الـمأموم) بێدەنگ بێت و گوێبگرێت ، کەواتە ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە قورئان خوێندن پێویست نیە لەسەر

---

[٤] أخرجه من حديث جابر : أحمد برقم (١٤٦٩٨) ، [٥ / ١٢٥] ، وابن ماجه : كتاب إقامة الصلاة ، باب (١٣) ، رقم (٨٥٠) ، [١ / ٤٦٣] ، واللفظ المذكور للبيهقي في سننه : كتاب الصلاة ، باب (٢٦٥) ، رقم (٢٨٩٨) ، [٢ / ٢٢٨] .

ئەو کەسەی کە لە پشت پێشنوێژەوەیە (المأموم) چونکە پێشنوێژ (الإمام) قورئان دەخوێنێت لە بری خۆی و ئەوانەش کە لە پشتیەوەن ، وە ئەم وتەیەش مەزهەبی ئەبوحەنیفە و ئەحمەدە .

**وتەی سێیەم** : کە وتەی ئیمامی مالکە و هەڵبژاردەی (شيخ الإسلام ابن تيمية) و کۆمەڵێك لە زانایانە ، دەڵێن : خوێندنی سورەتی فاتیحە واجبە لەسەر ئەو کەسەی کە لە پشت پێشنوێژەوەیە (المأموم) لە نوێژە بێدەنگەکاندا (الصلاة السرية) کە پێشنوێژ (الإمام) دەنگی تێدا بەرز ناکاتەوە وەکو نوێژی نیوەڕۆ و عەسر ، بەڵام لەو نوێژانەدا کە دەنگیان تێدا بەرز دەکرێتەوە (الصلاة الجهرية) ئەوا خوێندنی پێشنوێژ (الإمام) بەسە و ئەو کەسەش کە لە پشت پێشنوێژەوەیە (المأموم) پێویستە لەسەری بێدەنگ بێت و گوێبگرێت .

دەڵێن : بەم لێکدانەوەیە بەڵگەکان کۆدەبنەوە : چونکە ئەو بەڵگانەی کە خوێندنی سورەتی فاتیحە پێویست دەکەن ئەوا بەسەر نوێژە بێدەنگەکاندا (الصلاة السرية) ساغدەکرێنەوە و بەڵگەکانی تر و ئایەتە پیرۆزەکەش بەسەر ئەو نوێژانەدا کە دەنگیان تێدا بەرز دەکرێتەوە (الصلاة الجهرية) ساغدەکرێنەوە ، وە ئەم وتەیەش دادوەرترینی وتەکانە إن شاء الله .

**٣ ـ ناوەکانی سورەتی فاتیحە :**

ئەم سورەتە چەندین ناوی هەیە ، هەر ناوێکیشی بەڵگەیە لەسەر واتایەك ، وە هەر شتێك ناوی زۆر بێت ئەوە بەڵگەیە لەسەر فەزڵ و چاکێتی ئەو شتە .

ـ ئەم سورەتە ناودەبرێت بە : (**فاتحة الكتاب / دەروازەی کتێبی خوا**) ، چونکە نووسینەوەی موصحەفەکانی پێ دەستپێدەکرێت .

ـ وە ناودەبرێت بە : (**أُمُّ القرآن / بنەمای قورئان**) ، چونکە قورئان لەسەر ئەو واتایانە دەخولێتەوە کە ئەم سورەتە دەیگرێتە خۆ ، هەموو ئەو واتایانەش کە قورئان گرتویەتە خۆی و لە ئایەتەکانیدا بە وردی باسی لە بارەیانەوە کردووە ئەوا بە شێوەیەکی گشتی لەم سورەتەدا کۆبوونەتەوە .

ـ وە ناودەبرێت بە : (**الرُقيَـة / خوێندراوچارە**) ، چونکە بە مەبەستی چارەسەرپێکردن بەسەر نەخۆشدا دەخوێندرێت ، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە کە لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە کەوا :

چەند کەسێك لە صەحابەکانی پێغەمبەر (ﷺ) خۆیان لای ناوچەیەك لە ناوچە عەرەب نیشینەکان میواندار کرد و ئەوانیش میوانداریان نەکردن ، لەو کاتەدا پیاوە گەورە و سەرگەورەکەیان پێوەیدرا ـ مار یان دووپشك پێوەیدا ـ و هیچ چارەسەرێکیان بۆی نەدۆزیەوە ، ئەوەبوو هاتن بۆ لای ئەو چەند صەحابییە و داوای دوعاچارەیان لێکردن ، ئەوانیش فەرموویان : ئێوە میوانداری ئێمەتان نەکرد لەبەر

ئەوە ئێمەش بەسەریدا ناخوێنین تاوەکو بەرامبەرێکمان پێنەدەن ، ئەوانیش برگەیەك مەڕوماڵاتیان دەسنیشانکرد بۆیان ، ئەوەبوو یەکێك لەو صەحابیانە هەستا و سورەتی فاتیحەی بەسەردا خوێند ، دوای ئەوە پیاوەکە هەستا و چاك بوویەوە وەکو بڵێی کۆتوبەندی لێکرابێتەوە ، صەحابیەکانیش مەڕوماڵاتەکەیان وەرگرت و بردیان بەڵام هیچ هەڵسوکەوتێکیان تێیاندا نەکرد تاوەکو پرس بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەکەن ، کە هاتنەوە ڕۆیشتنە لای پێغەمبەر (ﷺ) و بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە ، ئەویش فەرمووی : ((وَمَا أَدْرَاكَ أَنَّهَا رُقْيَةٌ)) ئێوە چۆن زانیتان سورەتی فاتیحە خوێندراوچارەیە ؟ پاشان پێیانی فەرموو : ((اقْتَسِمُوا هَذِهِ الْغَنَمَ وَاضْرِبُوا لِي مَعَكُمْ بِسَهْمٍ))[٥] ئەم مەڕوماڵاتە دابەش بکەن و پشکێکیش بۆ من دابنێن ، وە فەرمووی : ((إِنَّ أَحَقَّ مَا أَخَذْتُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا كِتَابُ اللَّهِ))[٦].

واتە : بەڕاستی شایستەترین شتێك کە کرێی لەسەر وەربگرن کتێبەکەی خوایە .

- وە ناودەبرێت بە : (**الشَّافِيَة / شیفادەر**) ، چونکە شیفادەدات لە نەخۆشیەکان بە ئیزنی خوا ، شیفای دڵەکان دەدات و شیفای لاشەکانیش دەدات : شیفای دڵەکان دەدات لە گومان و خەیاڵ و وەسوەسەکان ، وە شیفای لاشەکانیش دەدات لە ئێش و ئازارەکان

---

[٥] متفق عليه من حديث أبي سعيد الخدري : البخاري : كتاب الإجارة ، باب (١٦) ، رقم : (٢٢٧٦) ، [٤ / ٥٧١] ، ومسلم : كتاب السلام باب : (٢٣) .

[٦] أخرجه البخاري من حديث ابن عباس : كتاب الطب ، باب (٣٤) ، رقم : (٥٧٣٧) ، [١٠ / ٢٤٤] .

هەروەکو چۆن ئەمە بە دی هات بۆ ئەو کەسەی کە پێوەیدرابوو .

- وە ناودەبرێت بە : (**السبعُ المثاني / حەوت ئایەتی دووبارە**) ، خـوای گـەورە فەرموویـەتی : ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِي وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ ﴾ [الـــحجر] ، واتــە : وە ئێمـە حـەوت ئایـەتی دووبـارە و قورئانی گەورە و مەزنمان پێداویت .

مەبەست بە (السَّبْعُ الْمَثَـانِي / حـەوت ئایـەتی دووبارە) سورەتی فاتیحەیە چونکە بریتیيە لە حەوت ئایـەت ، وە حەوتەکەش (الـسَّبْع) وەسـفکراوە بـە دووبـارە (الْمَثَـانِي) چـونکە خوێندنـەوەی دووبـارە دەکرێتەوە لە هەموو رکعاتێکدا .

پێغەمبەریش (ﷺ) لەم بارەیـەوە فەرموویـەتی : ((هِيَ السَّبْعُ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنُ الْعَظِيمُ الَّذِي أُوتِيتُهُ))[٧].

واتـە : سـورەتی فاتیحـە بـریتـیـیـە لـە حـەوت ئایـەتی دووبـارە و قورئانی گەورە و مەزن کە پێمدراوە .

ـ وە ناودەبرێـت بـە : (**الـصلاة / نوێـژ**) ، هـەروەکو چـۆن لـەم فەرموودە قودسیەدا هاتووە کە خـوای گـەورە فەرموویـەتی : ((قَسَمْتُ الصَّلَاةَ بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي نِصْفَيْنِ ...))[٨] واتە : من نوێژم لە نێوان خـۆم و عەبدەکەمدا کردووە بە دوو بەشەوە ، ئەنجا ئەو نوێژەشی بە سورەتی فاتیحە تەفسیر کردووە .

---

[٧] أخرجه البخاري من حديث أبي سعيد بن الـمعلّى : كتاب التفسير ، باب (١) ، رقم : (٤٤٧٤) ، [٨ / ١٩٦].

[٨] أخرجه مسلم من حديث أبـي هريرة : كتاب الصلاة ، باب (١١) ، رقم : (٣٩٥) ، [٢ / ٣٢٤] .

**٤ـ ژمارەی ئایەتەکانی :**

ئەم سورەتە بریتی‌یە لە حەوت ئایەت بە دەقی قورئان ، هەروەکو لە پێشەوە لە فەرمایشتی خوای گەورەدا باسکرا : ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ ﴾ [الحجر] .

واتە : ئێمە حەوت ئایەتی دووبارە و قورئانی گەورە و مەزنمان پێداویت .

جا فەرمایشتی : ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ ئەمە ئایەتێکە .

وە ﴿ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾یش ئایەتی دووەمە .

وە ﴿ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴾یش ئایەتی سێیەمە .

وە ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾یش ئایەتی چوارەمە .

وە ﴿ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴾یش ئایەتی پێنجەمە .

وە ﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ ﴾یش ئایەتی شەشەمە .

هەروەها ﴿ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾یش ئایەتی حەوتەمە .

ئەمە بۆچوون و مەزهەبی زۆرینەی زانایانە سەبارەت بە ژمارەی ئایەتەکانی .

وە بۆچوون و مەزهەبی ئیمامی شافعی ئەوەیە کە ﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧﴾ ﴾ یەك ئایەتە کە ئایەتی حەوتەمە ، وە ئایەتی یەکەمی ئەم سورەتە بریتی‌یە لە : ﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ

ﭽﭑ ﭒﭼ .

لەبەر ئەم جیاوازیە لە هەندێك موصحەفەكاندا نووسینی ژمارە (١) لە پاش ﭽﭑ ﭒ ﭓ ﭔ ﭕﭼەوە هەیە ، ئەمەش وەك ئاماژەیەكە بۆ ئەوەی كە ﭽﭑ ﭒ ﭓ ﭔﭼیش ئایەتێكە لە سورەتی فاتیحە ، وە لە هەندێكی تری موصحەفەكاندا ئەم ژمارەیە بوونی نیە لەبەر شوێنكەوتنی ئەو وتەیەی كە دەڵێت : ﭽﭑ ﭒ ﭓ ﭔﭼ ئایەتێك نیە لێی .

كەواتە ﭽﭑ ﭒ ﭓ ﭔﭼ بە لای (شافعی)ەوە ئایەتێكە لە سورەتی فاتیحە ، بەڵام بە لای زۆرینەی زانایانەوە (الـجمهور) ﭽﭑ ﭒ ﭓ ﭔﭼ ئایەتێك نیە نە لە سورەتی فاتیحە و نە جگە لە فاتیحەیش لە سورەتەكانی تری قورئان ، تەنها ئەوە نەبێت كە لە (سورة النمل)دا هاتووە چونكە ئەوەیان بە كۆڕا و یەكدەنگی زانایان بەشێكە لەو سورەتە ، ئەویش لە فەرمایشتی خوای گەورەدا : ﭽإِنَّهُۥ مِن سُلَيۡمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٣٠ﭼ [النمل] .

جگە لەوە ئەوا ﭽﭑ ﭒ ﭓ ﭔﭼ ئایەتێكی سەربەخۆیە و تایبەتیش نیە بە سورەتێكی دیاریكراوەوە ، لەبەر ئەمە لە هیچ موصحەفێكدا نووسینی ژمارە (١)ی تێدا نیە لە تێكڕای سورەتەكاندا جگە لە سورەتی فاتیحە نەبێت ، ئەوەش لەبەر ئەوەیە كە ﭽﭑ ﭒ

الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾ ئايەتێکی سەربەخۆیە و بۆ جیاکردنەوەی نێوان سورەتەکان لە یەکتر دابەزیوە .

لەبەر ئەمە لە سەرەتای هەموو سورەتەکاندا دەهێنرێت و دەوترێت جگە لە (سورة البراءة) نەبێت چونکە لە سەرەتای ئەم سورەتەدا ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾ دانەبەزێنراوەتە سەر پێغەمبەر (ﷺ) هەروەکو چۆن دابەزێنراوەتە سەری لە باقی سورەتەکانی تردا ، وە لە هۆی ئەوەشدا وتراوە : لەبەر ئەوەیە کە (سورة البراءة) تەواوکارە بۆ (سورة الأنفال) ، وە وتراوە : لەبەر ئەوەیە کە (سورة البراءة) بە شمشێر و سزا دابەزیوە و بە بەرائەت و حاشا لێکردن دەستپێکردووە بۆیە گونجاو نیە باسی بەزەیی و رەحمەتی پێشبخرێت ، خواش زاناترە .

## ٥ ـ لێکدانەوەی پەناگرتن و (بسم الله)کردن :

(أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ) بە یەکلایی بەشێك نیە لە سورەتی فاتیحە ، بەڵام ئەم پەناگرتنە بۆیە دەوترێت لەبەر کردەوە کردنە بە فەرمایشتی خوای گەورە : ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْءَانَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ ﴾ [النحل] .

واتە : ئەگەر ویستت قورئان بخوێنیت ئەوا پەنابگرە بە خوا لە شەیتانی دەرکراو لە رەحمەتی خوا .

ئەگەر موسڵمان ویستی قورئان بخوێنیت ئەوا لە سەرەتای قورئان خوێندنەکەیدا پەنادەگرێت بە خوا لە شەیتانی دەرکراو لە رەحمەتی

خوا و هەموو خێرێك .

وە (أَعُوذُ) واتاکەی بریتی‌یە لە : پەنادەگرم بە خوای گەورە و خۆمی پێدەپارێزم لەم دووژمنە ، (العَوْذ) بریتی‌یە لە : پەناگرتن و هانابردن بۆ لای خوا لە شەیتان .

وە (ٱلشَّيۡطَٰنِ) مەبەست پێی هەموو یاخی بوو و سەرسەختێکە لە مرۆڤ و جنۆکە و گیانلەبەران ، لە (شَاطَ الشيءُ إذا اشتدَّ)وە هاتووە واتە : توندبوو ، یان لە (شَطَنَ إذا بَعُدَ)وە هاتووە واتە : دوورکەوتنەوە ، چونکە شەیتان دوورە لە هەموو خێرێك .

(ٱلرَّجِيمِ) : (فَعِيلٌ بمعنى مفعول أي المرجوم) واتە : تێگیراو ، چونکە شەیتانەکان پارچە ئەستێرەیان تێدەگیرێت لە ئاسمانەوە بۆیە ناتوانن دزە گوێبیستی بکەن ، هەروەها تێیاندەگیرێت بە زیکری خوای پاك‌وبێگەرد و پایەدار ، کەواتە شەیتان (مرجوم)ـە بە واتای : دەرکراو و دوورخراوە لە خێر ، بۆیە موسڵمان هانا دەبات و پەنادەگرێت بە خوا لەم شەیتانە بۆ ئەوەی زەرەر و زیانی پێنەگەیەنێت ، وە پەنادەگرێت بە خوا لە تێکدان و فووتێکردن و هۆنراوە یان جادووی شەیتان ، بەم شێوەیە لە پەناگرتنی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە[٩].

---

(٩) كما في حديث الاستعاذة في الصلاة أبي سعيد الخدري : أخرجه أحمد برقم (١١٤٩٣) ، [٤ / ١٢٩] ، وأبو داود : كتاب الصلاة باب (١٢٢) ، رقم (٧٧٥) ، [١ / ٣٤٤] ، والترمذي : كتاب الصلاة باب (٦٥) ، رقم (٢٤٢) ، [٢ / ٩] ، وبنحوه أخرجه ابن ماجه عن جبير بن مطعم (٨٠٧) وعن ابن مسعود (٨٠٨) .

وه (الـــهمز) مەبەست پێی (الصرع)ـه واته : تێکدان و تێکچوون ، چـونکه هەنـدێك جـار شـەیتان مرۆڤــ تێکـدەدات و شـێت دەبێـت و جنۆکـه دەچـێته نـاو لەشـیەوە ، جـا ئـەم تووشـبوونه بـه تێکـدان و تێکچوون له شەیتانەوەیه ، وه فەرمایـشتەی خـوای گـەورە : ﴿ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ﴿٢٧٥﴾ ﴾ [البقــرة] واتــه : ﴿ئـەو کەسـەی کـه شــەیتان تێکیــدەدات و تێکــەڵ بــه لەشــی دەبێــت و دەســتی لـێدەوەشێنێت﴾ مەبەست پێی (الصرع)ـه واته : تێکدان و تێکچوون ، جا شەیتان دەچێته نـاو لەشی مرۆڤـــەوە و بـه نـاو لەشـیدا دەڕوات وەك ڕۆیشتنی خوێن ، وه هەندێك جاریش تێکیدەدات و شێتی دەکات ، وه ئەگەر خوا مرۆڤـ نەپارێزێت له شەیتان ئەوا زیانی پێدەگەیەنێت به وەسوەسه و خەیاڵات و تێکدان و تێکچوون .

وه (الــــنفخ / فــووتێکردن) واتاکـەی بـریتــیـیـه لـه : فیـززلـی و خۆبەگـەورەزانی (الكِبْــــر) ، چـونکه فیـززلـی و خۆبەگـەورەزانی لــه شەیتانەوەیه ، ئەوه فودەکات به مرۆڤدا و وای لێدەکات خۆی بەگەورە بزانێت .

وه (النفـــث) بـریتــیـیـه لـه : هـۆنراوه و شـیعر ، خـوای گـەورە فەرموویەتی : ﴿ وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ ﴿٢٢٤﴾ ﴾ [الشعراء] .

واتــه : هۆنراوەبێــژەکان و شـاعیرەکان کەسـانی سەرلێـشێوا و چەواشەکراو شوێنیان دەکەون .

کەواتە هۆنراوە و شیعر لە فووکردن و دەربڕینی شەیتانە جگە لەوانە نەبێت کە شیعری پاك و خاوێن و بەدوورن لە باسی نەشیاو ئەوا ئەمیان ستایشکراوە ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((إِنَّ مِنَ الْبَيَانِ لَسِحْرًا ، وَإِنَّ مِنَ الشِّعْرِ حُكْمًا))[١٠].

واتە : بەڕاستی هەندێك لە ڕەوانبێژی برتییە لە سیحر ، وە هەندێك لە شیعر بریتییە لە دانایی .

بەڵام زۆربەی شیعر خراپە و لە فوکردن و دەربڕینی شەیتانەوەیە .

وە وتراوەیشە : مەبەست بە (النفث) بریتییە لە : سیحر و جادوو ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ ۝٤ ﴾ [الفلق] .

واتە : وە پەنابەخوادەگرم لە خراپەی ئەو ئافرەتە جادوبازانەی کە فودەکەن بە گرێکاندا .

وە پەنابەخواگرتن لە پێش خوێندنەوەی قورئان لە نوێژدا و جگە لە نوێژیشدا سوننەتە ، لەبەر فەرمایشتی خوای گەورە : ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ۝٩٨ ﴾ [النحل] .

واتە : ئەگەر ویستت قورئان بخوێنیت ئەوا پەنابگرە بە خوا لە شەیتانی دەرکراو لە رەحمەتی خوا .

وە ئەمەش ڕەهایە حاڵەتی نوێژ و جگە لە نوێژیش دەگرێتەوە .

---

[١٠] أخرجه من حديث ابن عباس : أحمد برقم (٢٤٢٤) ، [١ / ٢٠١] ، وروى طرفه الأول عن جماعة من الصحابة ، وأخرجه أيضا أبو داود : كتاب الأدب باب (٩٥) ، رقم (٥٠١١) ، [٥ / ١٧٤] .

﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ :

پیتی (بِـــ) بۆ (استعانة) و داوای یارمەتی کردنە ، وە ئەمە (فعـــل / کردار)ێکی بۆ دانراوی هەیە ، بۆ دانرانەکەشی بریتـی‌یـە لـە : (أســتعین باسم الله) واتە : داوای یارمەتی دەکەم بە ناوی خواوە یان (أتــحــصن باسم الله) واتە : خۆم پشت‌قایم و پارێزراو دەکەم بە ناوی خواوە .

وە ناوی خوا (اسم الله) (مفردٌ مــضافٌ) تـاکی بەپاڵـەوەدراوە بۆیـە هـەموو ناوەکـانی خـوای گـەورە دەگرێتـەوە ، کەواتـە دەڵێیـت : خـۆم پشت‌قایم و پارێزراو دەکەم یان خێروفەڕ دەخوازم بە ناوەکـانی خـوای پاك‌وبێ‌گەرد و پایەدارەوە ، چونکە ناوەکـانی خـوای گـەورە پـیرۆز و بەفەڕ و موبارەکن ، خوای گـەورە فەرموویـەتی : ﴿ تَبَٰرَكَ ٱسْمُ رَبِّكَ ذِى ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٧٨﴾ ﴾ [الرحمن] .

واتە : پڕخێری و پیرۆزی بۆ ناوی پەروەردگاری خاوەن گەورەیی و ڕێز .

وە پێغەمبــەر (ﷺ) لـە دوعـا و پاڕانــەوەی دەسـتپێکردنی نوێـژدا دەیفەرموو : ((وَتَبَارَكَ اسْمُكَ)) واتە : خوایە پڕخێری و پیرۆزی بۆ ناوی تـۆ ، کەواتـە نـاوی خـوا پـڕخێـر و پـیرۆزە ، وە تـۆ فـەڕ و پـیرۆزی دەخوازیت بە ناوەکانی خواوە ، کەواتە وتـەی تـۆ (باســم الله : جـــار ومـــجرور متعلّقٌ بـــمحذوف) أي : (أتبرَّكُ وَأستعين باسم الله) واتە : فەڕ و پیرۆزی دەخوازم و داوای یارمەتی دەکەم بە ناوی خواوە .

وە (اللّٰه) : ناوێکی دیاریکراوە بۆ خوای پەرستراوی حەق ، وە ئەمە لە گەورەترین ناوەکانی خوای پاك‌وبێ‌گەرد و پایەدارە ، وە (اللّٰه) واتە : خوای پەرستراو ، لە (أَلِــه يُؤلَــه إذا عُبِدَ)وە هاتووە واتە : ئەگەر پەرسترا ، کەواتە خوای پاك‌وبێ‌گەرد و پایەدار پەرستراوە و لە هەموو پێویستیەکدا رووی تێدەکرێت .

(ٱلرَّحۡمَٰنِ) : ناوێکە لە ناوەکانی خوا کە سیفەتێك لە سیفاتەکانی دەگرێتەوە ئەویش بریتی‌یە لە : (الرحمة) بەزەیی .

(ٱلرَّحِيمِ )یش : بە هەمان شێوە ، کەواتە ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ : لە ناوەکانی خوان ، وە (الرحمة) بەزەییش لە سیفەتەکانیەتی ، وە هەموو ناوێك لە ناوەکانی خوای گەورە سیفەتێك لە سیفاتەکانی دەگرێتەوە .

وە جیاوازی نێوان (ٱلرَّحۡمَٰنِ) و (ٱلرَّحِيمِ) بریتی‌یە لەوەی کە : (ٱلرَّحۡمَٰنِ) واتە : خاوەنی رەحم و بەزەییەکی گشتی‌یە بۆ هەموو دروستکراوەکان ، بەڵام (ٱلرَّحِيمِ) : تایبەتە تەنها بە ئیماندارانەوە ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَكَانَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَحِيمٗا ﴿٤٣﴾ ﴾ [الأحزاب] .

واتە : وە خوا بە بەزەیی‌یە بە ئیمانداران .

## ٦ ـ تەفسیری ئایەتەکانی فاتیحە :

فەرمایشتی خوای گەورە : ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ :

(الــحمد) بریتی‌یە لە : بەچاك باسکردن و ستایشکردنی خوای پاك وبێ‌گەرد و پایەدار ، خوای پاك‌وبێ‌گەرد ستایش دەکرێت واتە :

ستایش دەکرێت بە ناو و سیفەت و کردەوەکانی‌یەوە ، (الحمد / ستایشکردن) گشتگیرترە لە (الشکر / سوپاسکردن) چونکە (الشکر / سوپاسکردن) لەسەر کردەوە نەبێت ناکرێت واتە : لەبەرامبەر نیعمەتێکدا دەکرێت کە خوا پێی داویت ، بەلام (الحمد / ستایشکردن) لەسەر ناو و سیفات و کردەوەکانیش دەکرێت ، کەواتە : (الحمد / ستایشکردن) گشتگیر ترە لە (الشکر / سوپاسکردن) ، ئەمەش جیاوازی نێوان (الحمد / ستایشکردن) و (الشکر / سوپاسکردن)ـە .

(الـ) لە فەرمایشتی ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾دا : بۆ تێکڕابوونە (للاستغراق) واتە هەموو ستایش و بە چاك باسکردنەکان بۆ خوای پاك‌وبێ‌گەرد و پایەدارە بە خاوەندارێتی و شایستەیەتیش ، جا هیچ کەسێك شایستەی ستایش و بە چاك باسکردن نی‌یە بە ڕەهایی جگە لە خوای گەورە نەبێت ، چونکە تەنها ئەو نیعمەت بەخشە و خاوەنی نازونیعمەتی ڕەهایە ، بۆیە ستایشی ڕەهاش بۆ خوای پاك‌وبێ‌گەرد و پایەدارە ، بۆیە لە فەرمایشتی ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾دا واتە : هەموو ستایش و بە چاك باسکردنەکان بۆ خوای پاك‌وبێ‌گەرد و پایەدارە ، بەلام دروستکراو ئەوا ستایش دەکرێت بە ئەندازەی ئەوەی کە خێری لێ‌دەوەشێتەوە ، بەلام خوا هەر خۆشی ئەو خێرەی تێدا داناوە ، کەواتە : بنەمای (الحمد / ستایشکردن) تەنها بۆ خوای گەورەیە .

فەرمایشتی ﴿رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ : (الـــرب) بـریتـییـە لـە : پەروەردگاری دروستکراوەکان بە نیعمەتەکانی کە خوای پاك‌وبێگەرد و پایەدارە ، وە ئەویش خاوەنیانە ، جا (الرب) بە ڕەهایی دەوترێت و مەبەست پێی پەروەردگارە ، وە دەوترێت و مەبەست پێی خاوەندارە ، وە خوا خاوەنی هەموو دروستکراوەکانە ، وە دەوترێت و مەبەست پێی چاکسازیکارە ، وە خوای پاك‌وبێگەرد و پایەدار ئەو کاروباری بەندەکانی چاك دەكات و سەرپەرشتیان دەكات ، وە وتەی (الرب) بە ڕەهایی بەکارناهێنرێت جگە لە بۆ خوای پاك‌وبێگەرد و پایەدار نەبێت ، بەڵام بەکارهێنانی بۆ جگە لە خوا ئەوا دەبێت بەند بکرێت بەوەی کە دەدرێتە پاڵی ، دەوترێت (ربُّ الدار) ، (ربُّ الإبل) واتە : خاوەن ماڵ و خاوەن وشتر .

بەڵام ئەگەر بە ڕەهایی وترا (الرب) یان (رب العـالمين) ئـەوا تـەنها تایبەتە بە خوای پاك‌وبێگەردەوە و دروست نـییـە وەسفی جگـە لـە خوای پێبکرێت .

وە ﴿ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ : کۆی (العالَــم)ـە ، کە بـریتـییـە لـە : هـەموو شتێك جگە لە خوای پاك‌وبێگەرد و پایەدار نەبێت ، وە جیهانیەکانیش لە بونـەوەردا زۆرن کـەس نایانزانێـت جگـە لـە خـوای پـاك‌وبێگـەرد و پایەدار نەبێت ، لەوانەش : جیهانی مرۆڤ ، جیهانی جنۆکە ، جیهـانی فریـشتە ، جیهـانی بێگیانـەکان و جیهـانی گیانلەبـەران ، هـەموو ڕەگـەزەکانی دروسـتکراوەکان پێیـان دەوترێـت : جیهانیـەکان ، وە

پەروەردگاریان بریتی‌یە لە خوای گەورە ، هیچ کەسێك لە پەروەردگارێتی خوای پاك‌وبێگەرد و پایەدار دەرناچێت .

فەرمایشتی خوای پایەدار ﴿ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ : تەفسیری ئەم دووانەمان زانی لە لێکدانەوەی (بسم الله)دا .

فەرمایشتی خوای پایەدار ﴿ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴾ : لە خوێندنەوەیەکدا (مالِك) بە ئەلیفەوەیە ، وە لە خوێندنەوەیەکی تردا (مَلِك) دەخوێنرێتەوە ، وە هەردوو خوێندنەوەکەش صەحیح و ڕاستن ، خوا هەر خۆی خاوەن و پادشایە .

﴿ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴾ : مەبەست بە ﴿ ٱلدِّينِ ﴾ لێرەدا : لێپرسینەوە و پاداشتە ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ كَلَّا بَلْ تُكَذِّبُونَ بِٱلدِّينِ ۝٩ ﴾ [الانفطار] أي : الحساب والجزاء ، واتە : نەخێر ئێوە لێپرسینەوە و پاداشت بە درۆ دەخەنەوە .

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ۝١ ﴾ [الماعون] .

واتە : ئا ئەو کەسە نابینیت کە باوەڕی بە لێپرسینەوە و پاداشت نی‌یە .

واتە : پاداشت و لێپرسینەوە و زیندووبوونەوە بە درۆ دەخاتەوە .

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِٱلدِّينِ ۝٧ ﴾ [التين] .

واتە : دوای ئەوە کێ تۆ بە درۆ دەخاتەوە سەبارەت بە لێپرسینەوە

و پاداشت لە ڕۆژی قیامەتدا ، (یـوم الـدِّین / ڕۆژی لێپرسینەوە و پاداشت) واتە : (یوم القیامة / ڕۆژی قیامەت) ، ناونراوە بە (یوم الدِّین / ڕۆژی لێپرسینەوە و پاداشت) چونکە ڕۆژی پاداشت و لێپرسینەوەیە .

لەبەر چی فەرموویەتی : ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾ ؟ لە کاتێکدا کە ئەو خاوەنی قیامەت و جگە لە قیامەتیشە ، (یوم الدِّین / ڕۆژی لێپرسینەوە و پاداشت) تایبەتکراوە بە باسکردن چونکە لەو ڕۆژەدا خاوەنداریتی نی یە جگە لە بۆ خوای پاك‌وبێگەرد و پایەدار نەبێت هەروەکو فەرموویەتی : ﴿لِّمَنِ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَۖ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ ١٦﴾ [غافر] .

واتە : ئایا ئەمڕۆ موڵك و خاوەنداریتی بۆ کێیە ؟ تەنها بۆ خوای تاك و تەنها و باڵادەستە .

پادشاکان و تاك تاکی خەڵك لەو ڕۆژەدا یەکسانن ، هیچ کەسێك موڵکی نی یە جگە لە خوای گەورە نەبێت ، لەبەر ئەوە بە تایبەتی باسی کردووە لە فەرمایشتی ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾دا هەرچەندە خوای پاك وبێگەرد و پایەدار خاوەنی جگە لە ئەو ڕۆژەیشە لەبەر ئەوەی کە لەو ڕۆژەدا موڵکی جگە لە خوا نامێنێت تێیدا ، هەر بۆیە لە فەرموودەدا هاتووە : ((إِنَّ اللهَ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى يَقُولُ : أَنَا الْمَلِكُ ، أَيْنَ الْجَبَّارُونَ ؟ أَيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ ؟))[١١].

واتە : بەڕاستی خوای پاك‌وبێگەرد و پایەدار دەفەرموێت : من

---

(١١) أخرجه مسلم من حديث عبد الله بن عمر : كتاب صفات المنافقين ، باب (١) ، رقم : (٢٧٨٨) ، وأصله في البخاري : كتاب التوحيد باب (١٩) رقم (٧٤١٢) [٣ / ٤٨٠] .

پادشام ، کوان ستمکارە خۆسەپێنەرەکان ؟ کوان خۆبەگەورەزانەکان ؟

وە ئەمەش وەکو ئەو فەرمایشتەی خوای پاك‌وبێ‌گەرد و پایەدارە :

﴿لِّمَنِ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَۖ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ ١٦﴾ [غافر] .

واتە : ئایا ئەمرۆ موڵك و خاوەنداریتی بۆ کێیە ؟ تەنها بۆ خوای تاك و تەنها و باڵادەستە .

لەم ڕۆژەدا هەموو خەڵك یەکسانن : پادشا و کۆیلەکانیان ، فەقیر و دەوڵەمەندیان و ڕێزدارەکانیان ، هیچ کەسێك لە کەسێکی تر جیا ناکرێتەوە تەنها بە کردەوەی چاك نەبێت .

فەرمایشتی خوای گەورە : ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ﴾ :

﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ﴾ واتە : تایبەتت دەکەین بە پەرستن ، وە ﴿إِيَّاكَ﴾ی پێش خستووە بۆ ئەوەی ئاماژەیەك بێت بۆ تایبەتمەندێتی ، وە هیچ کەسێك شایستەی پەرستن نییە جگە لە خوای پاك‌وبێ‌گەرد و پایەدار نەبێت ، وە ئەمەش لە بابەتی حەصر و کورتهەڵهێنانە ، چونکە پێشخستنی کارتێکراو بەسەر کارتێکەردا حەصر و کورتهەڵهێنان دەگەیەنێت ، واتە : هیچ کەسێك شایستەی پەرستن نییە جگە لە تۆ .

﴿وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ﴾ واتە : داوای یارمەتیت لێ‌دەکەین ، وە داوای یارمەتی لێ‌کردن جۆرێکە لە عیبادەت و پەرستن ، باشە لەبەر چی بە تەنها باسی کردووە لە کاتێکدا کە دەچێتە ناو فەرمایشتی ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ﴾ەوە ؟

وتویانە : ئەمە لە بابەتی (عطف الخاص على العام)ـەوەیە ، ئەوەش لەبەر ئەوەیە چونکە عیبادەت و پەرستن حەق و مافی خوای گەورەیە ، وە داوای یارمەتی لێکردن حەق و مافی دروستکراوەکانە ، چونکە مەخلوق و دروستکراو داوای یارمەتی دەکات لە خوا و پێویستیەکانی لێدەخوازێت .

وە ﴿إِيَّاكَ﴾ی دووبارە کردووەتەوە و نەیفەرمووە (إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَنَسْتَعِينُ) لەبەر هۆکاری جەختکردنەوەی تایبەتمەندێتی و ئەوەی کە هیچ کەسێك شایستەی پەرستن و شایستەی داوای یارمەتی لێکردن نییە جگە لە خوای پاكوبێگەرد و پایەدار نەبێت ، تەنها ئەو یارمەتیدەرە ، وە هەموو دین و ئاینیش لەسەر پەرستن و داوای یارمەتی لێکردن دەسوڕێتەوە ، لەسەر ئەم دوو وتە گەورەیە : ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ .

فەرمایشتی خوای گەورە : ﴿ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾ ئەمە دوعا و پاڕانەوەیە کە پێی دەوترێت دوعا و پاڕانەوەی داواکاری (دُعَاءُ المسألة) ، وە ئەوەی کە پێشتر لە سەرەتای ئەم سورەتەدا باسکرا کە فەرمایشتی ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ـە بریتییە لە دوعا و پاڕانەوەی پەرستن (دُعَاءُ العبادة) ، چونکە دوعا دابەش دەبێت بە سەر دوو بەشدا :

یەکەم : دوعا و پاڕانەوەی پەرستن (دُعَاءُ العبادة) بریتییە لە

ستایشکردنی خوا ، وه ستایشکردنی خوایش پاڕانهوهیه که دوعا و پاڕانهوهی پهرستنه .

دووهم : دوعا و پاڕانهوهی داواکاری (دُعَاءُ الـــمسألة) : وه بهشێك لێی بریتییه له فهرمایشتی : ﴿ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴾ تاوهکو کۆتایی سورهتهکه .

﴿ ٱهْدِنَا ﴾ هیدایهت بریتییه له : ڕێپیشاندان و ڕێنماییکردن ، واته : ڕێگهمان پیشان بده و ڕێنماییمان بکه .

وه هیدایهتیش چوار بهشه ، بهڵام گرنگترینیان دوو بهشه :

**بهشی یهکهم** : هیدایهتی ڕێپیشاندان و ڕێنماییکردن ، که ئهمهش گشتییه له دوو ڕووهوه :

له ڕووی ئهوهی که ڕێپیشاندان و ڕێنماییکردن بۆ باوهڕدار و بێباوهڕیش دێته دی ، وه خوای گهوره ڕێنمایی کافر و بێباوهڕداریشی کردووه ، به واتایهی ئهوهی کهوا ڕێپیشانداوه و ڕێنمایی کردووه و ڕێگای حهقی بۆی ڕوون کردۆتهوه ، خوای گهوره فهرموویهتی : ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ ﴿١٧﴾ ﴾ [فصلت] أي : أرشدناهم .

واته : ڕێنمایی گهلی سهمودمان کرد و ڕێگای حهق و ڕاستیمان بۆیان ڕوون کردهوه بهڵام ئهوان کوێرهوهریان پێخۆشتر بوو له ڕێنمایی .

ههروهها ئهمهیان گشتگیره له ڕووی ئهو کهسهی که ڕێنمایی دهکات و ڕێگای حهق پیشانی خهڵك دهدات ، که ئهمهش پێغهمبهر

(ﷺ) و ئەوانەش کە شوێنی کەوتوون دەگرێتەوە : ﴿وَإِنَّكَ لَتَهْدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسْتَقِيمٖ ٥٢﴾ [الشورى] .

واتە : وە بەڕاستی تۆ ـ ئەی پێغەمبەری خوا ـ ڕێنمایی خەڵك دەکەیت بۆ لای ڕێگای ڕاست .

**بەشی دووەم** : هیدایەتی تەوفیق و ئاسنکاری بۆ کردنە بۆ وەرگرتنی حەق و ڕاستی ، هەروەها ئەمەش تایبەتە لە دوو رووەوە : ئەمە بۆ باوەڕدار نەبێت نایەتە دی ، کە ئەمەش لە تایبەتمەندیەکانی پاكوبێگەرد و پایەدارە ، هەر بۆیە ئەم بەشەیانی رەدکردووەتەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و فەرموویەتی : ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَآءُۚ ٥٦﴾ [القصص] .

واتە : بەڕاستی ئەی پێغەمبەری خوا تۆ ناتوانیت هیدایەتی ئەو کەسە بدەیت کە خۆشیت دەوێت بەڵام خوا هیدایەتی کەسانێك دەدات کە خۆی ویستی لێی ببێت .

فەرمایشتی ﴿ ٱهْدِنَا ﴾ : هەر دوو بەشە هیدایەتەکە دەگرێتەوە :

هیدایەتی ڕێپیشاندان و ڕێنمایی‌کردن (هداية الدَّلالة والإرشاد) ، هەروەها هیدایەتی تەوفیق و ئاسنکاری بۆ کردن بۆ وەرگرتنی حەق و ڕاستی (هداية التوفيق) ، واتە : ڕێمانپیشان بدە و ڕێنماییمان بکە ، وە دامەزراو و موفەقمان بکە .

﴿ ٱلصِّرَٰطَ ﴾ : له زمانه‌وانیدا بریتی‌یه له : ئه‌و ڕێگایه‌ی که خه‌ڵکی و ئاژه‌ڵ به‌سه‌ریدا ده‌ڕۆن ، وه مه‌به‌ست به ﴿ ٱلصِّرَٰطَ ﴾ لێره‌دا : بریتی‌یه له : ئیسلام و قورئان و پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ، هه‌ر یه‌ك له‌و سیانه ناونراوه ڕێگا چونکه ده‌تگه‌یه‌نێت به خوای پاك‌وبێگه‌رد و پایه‌دار .

﴿ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴾ : واتاکه‌ی بریتی‌یه له : ئه‌و ڕێگایه‌ی که لاری و خوار و خێچی و تاریکی و شاراوه‌یی تێدا نه‌بێت ، ڕێگایه‌کی ڕاست و ڕوونه ئه‌و که‌سه‌ی به‌سه‌ریدا بڕوات ون و گومڕا نابێت ، به پێچه‌وانه‌ی ڕێچکه لار و خوار و خێچ و جیاوازه‌کان که ئه‌و که‌سه‌ی به‌سه‌ریدا ده‌ڕوات ون و گومڕا و سه‌رلێشێواو ده‌بێت ، بۆیه خوای په‌روه‌ردگار فه‌رموویه‌تی :

﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾﴾ [الأنعام] .

واته : به‌ڕاستی ئه‌مه ڕێگا ڕاسته‌که‌ی منه و شوێنی که‌ون ، وه شوێنی ڕێچکه‌کان مه‌که‌ون چونکه له ڕێگاکه‌ی خوا لاتان ده‌دات و په‌رته‌وازه‌تان ده‌کات ، ئه‌وه ئامۆژگاری خوایه بۆتان بۆ ئه‌وه‌ی خۆپارێزی بکه‌ن .

بۆیه ڕێگای خوا یه‌کێکه و پارچه‌پارچه و لاری و خوار و خێچی و لێڵی و تاریکی و شاراوه‌یی و ناڕوونی تێدا نی‌یه ، به‌ڵام ڕێگای لار و خوار و خێچ ئه‌وا ئه‌مه ڕێگای گومڕایی و سه‌رلێشێوانه په‌نا به خوا .

بۆیە کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ ...﴾ هێڵێکی ڕاستی کێشا و پاشان چەند هێڵێکی زۆری تری بە لای ڕاست و چەپی ئەو هێڵە ڕاستەدا کێشا و بە هێڵە ڕاستەکەی فەرموو : **ئەمە ڕێگای خوایە** ، وە سەبارەت بە ڕێگاکانی تر فەرمووی : ئەمانەش ڕێچکەن ، وە لەسەر هەر ڕێچکەیەکیش شەیتانێکی لەسەرە و بانگەوازی بۆ دەکات[١٢] .

فەرمایشتی خوای گەورە : ﴿ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ ﴾ : ڕێگا هەندێك جار خوا دەیداتە پاڵ خۆی وەکو فەرمایشتی خوای گەورە : ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ ...﴾ وە فەرمایشتی : ﴿وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ (٥٢) صِرَاطِ اللَّهِ ... (٥٣)﴾ [الشورى] .

خوای پاكوبێگەرد و پایەدار **ڕێگا** دەداتە پاڵ خۆی چونکە خۆی دایناوە و ڕێنمایی بۆ کردووە و ڕوونی کردووەتەوە بۆ خەڵکی ، وە هەروەها لەبەر ئەوەی کە گەیەنەرە بە خوای گەورە ، بۆیە داویەتە پاڵ خۆی دانەپاڵێکی ڕێزلێنراو (إضافة تشريف وتكريم) ، وە ئەم دانەپاڵەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەم ڕێگایە گەیەنەرە بە خوای پاكو بێگەرد و پایەدار ، وە جاری واش هەیە دەیداتە پاڵ پەیڕەوکارانی ئەو

---

(١٢) أخرجه من حديث ابن مسعود : أحمد برقم (٤١٤٢) ، والحاكم : كتاب التفسير ، رقم (٣٢٩٤) وقال : حديث صحيح الإسناد ولم يخرجاه ، وأخرجه ابن ماجه من حديث جابر : كتاب المقدمة ، باب (١) ، رقم (١١) ، [١ / ١٥] .

ڕێگایە وەکو ئەم ئایەتە : ﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ ﴾ ، داویەتە پاڵ ئەو کەسانەی کە نیعمەتی داوە بەسەریاندا ، چونکە ئەوانن کە بەسەریدا دەڕۆن بە پێچەوانەی گومڕایان کە لەسەر چەندین ڕێچکەی گومڕایین .

﴿ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ ﴾ : کە تۆ ئەوانت ڕێنمایی کردووە بۆ گرتنەبەری ئەو ڕێگایە و سەرکەوتویانت کردووە بۆی ، وە ئەمەش گەورەترین نیعمەتە لە خوای پاك‌وبێ‌گەرد و پایەدارەوە ، بەڵام ئایا ئەو کەسانە کێن کە خوا نیعمەتی خۆیی داوە بەسەریاندا ؟

خوای گەورە ئەمەی ڕوون کردووەتەوە لە ئەم فەرمایشتەیدا :

﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا ٦٩ ﴾ [النساء] .

واتە : وە هەر کەسێك گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر بکات ئەوا ئەو کەسە لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدانی ڕێبازی خوا و پیاوچاکاندا دەبێت کە ئەوانیش باشترین هاوڕێن .

ئەم ڕێگایە کێ بەسەریدا دەڕوات ؟ ئەوانە بەسەریدا دەڕۆن کە خوا ناز و نیعمەتی خۆیی داوە بەسەریاندا لە :

پێغەمبەران : ئەم کۆمەڵەیەش یەکەم دەستەن کە بەسەریدا ڕۆشتون ، وە ڕاستگۆیان : چونکە ڕاستگۆیان باشترینی خەڵکن لە دوای پێغەمبەران ، وە شەهیدانی ڕێگای خوا : لە پاش پلەی ڕاستگۆیانەوە دێن ، وە پیاوچاکانیش کە تێکڕای باوەڕدارانن .

کەواتە ئەوانەی بەسەر ئەم ڕێگایەدا دەڕۆن چەند چینێکن :

چینی یەکەم بریتین لە : پێغەمبەران ، پاشان بە دوایاندا ڕاستگۆیان ، پاشان بە دوایاندا شەهیدان ، پاشان بە دوایاندا پیاوچاکانی لە هەموو ئوممەتێك ، داواکارم لە خوا ئێمە و ئێوەش وا لێبکات کە بەسەر ئەو ڕێگا ڕاستەدا بڕۆین لەگەڵ ئەو چینە ڕێزدارانەدا ﴿وَحَسُنَ أُولَـٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴾ کە ئەوانیش باشترین هاوڕێن ، وە مرۆڤ لەم دونیایەدا کاتێك کە بەسەر ڕێگای ڕاستدا دەڕوات چەند بەرتەسکی و ناڕەحەتی و سەختی یەك دەبینێت ، وە هەست بە نامۆیی و تەنهاییەکیش دەکات لە نێو خەڵکدا ، بگرە جاری واش هەیە تووشی لێدان و پێداهەڵکوڵان و هەڕەشە و سووکایەتی پێکردنیش دەبێتەوە .

جا کاتێك بیربکاتەوە کە هاوڕێیانی ئەوانەن کە خوا نیعمەتی خۆیی بەسەردا داون لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان لەو کاتەدا دڵی ئارام دەبێت و دان بەخۆدا دەگرێ و خۆڕاگر دەبێت بەرامبەر ئەوەی کە تووشی دەبێت لەسەر گرتنەبەری ئەو ڕێگایە ، وە ڕۆیشتن بەسەر ئەم ڕێگایەدا دەوردراوە بە ناخۆشی و دەوردراوە بە سەختی و ناڕەحەتی ، ئەو ڕێگایە گوڵڕاخراو نەکراوە ، بۆیە گرتنەبەری ئەم ڕێگایە پێویستی بە ئارامگرتنێکی زۆر درێژخایەن و بڕیار و سووربوونی چەختلەسەرکراو هەیە ، وە لەوەی کە یارمەتیت بدات لەسەر گرتنەبەری ئەم ڕێگایە و سەختی و ناڕەحەتییەکانت لەسەر سووك و ئاسان بکات بیرکردنەوەتە لەوەی کە تۆ هاوڕێیەتی ئەو

کەسانە دەکەیت ، بەڵام ئەمە پێویستی بە باوەڕ هەیە، وە کەمیش هەیە کە سەرکەوتوو بکرێت بۆ ئەوە : ﴿ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٣٥﴾ ﴾ [فصلت] .

واتە : کەس سەرکەوتوو ناکرێت بۆ ئەوە تەنها ئەو کەسان نەبێت کە خۆڕاگرن و کەس سەرکەوتوو ناکرێت بۆ ئەوە تەنها ئەو کەسانە نەبێت کە خاوەنی بەشێکی گەورەن لە خێر .

کەواتە ئەوانەی کە خوا نیعمەتی داوەبەسەریادا بریتین لە : هەڵگرانی زانستی بەسوود و کردەوەی چاك لە : پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان .

فەرمایەشتی خوای گەورە : ﴿ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ ﴾ : ئەوانەی کە توڕەیی خوایان لەسەرە کێن ؟

ئەوانەن کە زانستیان پێیە بەڵام کردەوەیان نیيە ، فێری زانستی بە سوود بوون و شارەزا بوون بەڵام کردەوەیان نەکردووە بە زانستەکەیان ، ئا ئەوانە توڕەیی خوایان لەسەرە چونکە سەرپێچی خوایان کردووە بە زانست و بەرچاوڕۆشنیەوە ، ئەمەش هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە کردەوە ناکەن بە زانستەکەیان ئەوانە توڕەیی خوایان لەسەرە ، لە پێش هەموو ئەوانەشەوە جوولەکەکانن چونکە جوولەکە زانستیان لابوو ، وە خوای گەورە لە قورئاندا بە خاوەن کتێب و بە خاوەن زانست ناوی بردوون بەڵام لەبەر ئەوەی کاتێك کردەوەیان نەکرد بە زانستەکەیان خوا تووڕەبوو لێیان ، وە ئەمەش تایبەت نییە

بە ئەوانەوە ، بەڵکو گشتی‌یە بۆ هەموو کەسێك کە ڕێگا و ڕێچکەی ئەوان بگرێتەبەر لە ئەوانەی کە زانست فێر دەبن و کردەوەی پێناکەن.

﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ گومڕایان بریتین لە : ئەوانەی کە بە بێ زانست کردەوە دەکەن ، چونکە ئەمانە لەسەر زانست و ڕێنمایی نین ، نمونەیان وەکو نمونەی کەسێك وایە کە بەسەر ڕێگایەکدا بڕوات و ڕێگاکەش نەناسێت ، ئایا ئەو کەسەی کە بە وشکانیدا دەڕوات و ڕێگاکەش نەناسێت ئایا پێی ناوترێت گومڕا و ئەو کەسە لە ڕێگای مەترسی و تیاچوون و فەوتاندا نی‌یە ؟ بۆیە ئەو کەسەی کە بە بێ زانست کردەوە بکات لەشەرعدا گومڕایە پەنا بە خوا ، هەر چەندە کردەوە دەکات و خۆی ماندوو دەکات و خۆی لە خوا نزیك دەکاتەوە و دەگرێت و هاواردەکات و بەهەشتی دەوێت ، بەڵام لەبەر ئەوەی کە لەسەر ڕێگای ڕاست نەڕۆیشتووە ئەوا ئەوانە سوودی پێناگەیەنن .

وە (گاورەکان / النصارى) دەچنە ریزی گومڕایانەوە لەبەر ئەوەی کە کردەوەیان کردووە بە بێ زانست ، وە خورافیەکان و بیدعەکارانیش دەچنە ریزیانەوە لەبەر ئەوەی کە بە بێ زانست کردەوە دەکەن .

بۆیە نوێژخۆین و خوێنەری (سورەتی فاتیحە) داوا لە خوا دەکات دووری بخاتەوە لە ڕێگای ئەم دوو جۆرە لە مرۆڤ : ئەوانەی کە زانستیان پێیە و کردەوەی پێ ناکەن ، وە ئەوانەش کە کردەوەیان پێیە بەڵام بە بێ زانست .

له ئێستادا هەندێ کومەڵ و جەماعات هەن زانست و فێربوونی بە کەم بایەخ پیشانی خەڵکی دەدەن ، پێیان دەڵێن : خۆتان سەرقاڵ بکەن بە پەرستن و زیکرکردنەوە و لە پێناوی خوادا دەربچن مەبەستیشیان بە لە پێناوی خوادا بریتی‌یە لە : دەرچوون و گەشت و گەران بە شارەکاندا ، وە خەڵکی لە فێربوونی زانست ساردەکەنەوە و فێربوونی زانست بە کەم بایەخ پیشان دەدەن و لە رێز و پایەی زانست و زانایان کەم دەکەنەوە ، وە ئەم رێگایشە گومراییە پەنابەخوا ، بۆیە دەبێت لەسەرەتادا لە زانستەوە دەست پێ بکرێت چونکە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ ﴿١٩﴾ ﴾ [محمد] .

واتە : بزانە کەوا هیچ پەرستراوێك نی‌یە شایستەی پەرستن بێت جگە لە خوا و داوای لێخۆشبوون بکە بۆ تاوانەکانت .

بە زانست دەستی پێ کرد پێش وتە و کردەوە .

وە ئەو ئایەتانەی پێشوو بەڵگەبوون لەسەر ئەوەی کە خەڵکی سەبارەت بە زانست و کردەوە کردن سێ چینن :

ـ جا ئەوانەی کە زانستی بەسوود و کردەوەی چاکیان پێکەوە کۆکردووەتەوە ئەوانەن کە خوا نیعمەتی داوەبەسەریاندا ، ئەوانەی کەوا لەم سورەتەدا داوا لە خوا دەکەیت کە رێنماییت بکات بۆ سەر رێگاکەیان .

ـ وە ئەوانەش کە زانستیان وەرگرتووە و وازیان لە کردەوە کردن هێناوە ئەوانن کە تورەیی خوایان لەسەرە و خوا لێیان تووڕەیە ، جا لە هەر میللەتێك یان لە هەر ئایینێك بن .

ـ وە ئەوانەش کە کردەوەیان وەرگرتووە و وازیان لە زانستیان هێناوە ئەوانە گومڕایانن ، ئەم دوو گروپە زەرەرمەندن ، داوای سەلامەتی لە خوا دەکەین .

جا ئەگەر تێڕامێنێیت لە ئەم سورەتە ئەوا لە نهێنی گەورەییەکەی تێدەگەی ، وە خوا لە هەموو رکاتێك لە رکاتەکانی نوێژدا داینەناوە بخوێنرێت تەنها لەبەر پلەوپایە و گەورەییەکەی نەبێت لە نێوان تێکڕای سورەتەکاندا .

وە بەشێك لەو پلەوپایە و گەورەییە ئەوەیە کە ئەم سورەتە ئەم دوعا و پاڕانەوە گەورەیەی لە خۆ گرتووە : دوعا و پاڕانەوەی پەرستن (دُعَاءُ العبادة) لە سەرەتاکەیدا و دوعا و پاڕانەوەی داواکاریش (دُعَاءُ الـمسألة) لە کۆتاییەکەیدا ، ئەم سورەتە هەمووی دوعا و پاڕانەوەیە ، جا لەبەر ئەمە سوننەتە لە نوێژدا ئەگەر نوێژخوێن کۆتایی بە خوێندنەوەی ئەم سورەتە هێنا بڵێت : (آمِیْن) بۆ پێشنوێژ (الإمـام) و ئەو کەسەش کە لە پشت پێشنوێژەوەیە (الـمأموم) و ئەو کەسەش کە بە تەنها نوێژ دەکات (الـمنفرد) وتەی (آمِیْن) بۆ هەموویان سوننەتە ، وە(آمِیْن)یش واتاکەی بریتییە لە : (اللهُمَّ اسْتَجِبْ) واتە : خوایە وەڵامم بدەرەوە واتە : خوایە ئەم دوعایەم گیرا بکە و وەڵامی بدەرەوە ،

كەواتە (آمِيْن) داوای وەڵامدانەوەی دوعا و پاڕانەوەی ئەم سورەتەیە ، وە (آمِيْن) واجب نىیە لە نوێژدا ، وە سوننەتە لە نوێژە ئاشكراكاندا (الصلاة الـجهرية) بە دەنگی بەرز (آمِيْن) بڵێت ئەمە ئەگەر پێشنوێژ بێت (الإمام) یان لە پشت پێشنوێژەوە بێت (الـمأموم) یان بە تەنها نوێژ بكات (الـمنفرد) ، بەڵام ئەگەر بە هێمنی و كپی خوێندی ئەوا بە هێمنی و كپی دەیڵێت .

### ٧ ـ ئەوەی كە لە بارەی فەزڵیەوە هاتووە :

وە بەشێك لە گەورەیی ئەم سورەتە ئەوەیە كە لەم فەرموودە قودسیەدا هاتووە ـ لە (صحیحی موسلم)دا ـ كە خوای گەورە دەفەرمووێت : ((قَسَمْتُ الصَّلَاةَ بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي نِصْفَيْنِ ، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ)) واتە : من نوێژم لە نێوان خۆم و عەبدەكەمدا كردووە بە دوو بەشەوە ، وە عەبدەكەم داوای هەر شتێك بكات پێی دەبەخشم ، وە مەبەست بە نوێژ لێرەدا سورەتی فاتیحەیە ، ناونراوە بە نوێژ چونكە لە ناو نوێژدا دەخوێنرێت ، وە لەبەر ئەوەی (الـصلاة) لەزمانەوانیدا : واتە : دوعا و پاڕانەوە ، وە سورەتی فاتیحەش دوعا و پاڕانەوەیە .

فەرمایشتی : (لە نێوان خۆم و عەبدەكەمدا كردووە بە دوو بەشەوە) : ئەم سورەتە حەوت ئایەتە : سێ ئایەت و نیوی بۆ خوای گەورەیە ، وە سێ ئایەت و نیویشی بۆ عەبد و بەندەیە :

((فَإِذَا قَالَ الْعَبْدُ : ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ ، قَالَ اللَّهُ تَعَالَى : حَمِدَنِي عَبْدِي ، وَإِذَا قَالَ : ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ ، قَالَ اللَّهُ تَعَالَى : أَثْنَى عَلَيَّ عَبْدِي ، وَإِذَا

قَالَ : ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾ ، قَالَ اللَّهُ تَعَالَى : مَجَّدَنِي عَبْدِي ، وَإِذَا قَالَ : ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴾ ، قَالَ : هَذَا بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ)) .

واتە : جا ئەگەر بەندە وتی : ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ خوای گەورە دەفەرموێت : بەندەکەم سوپاسی کردم ، وە ئەگەر وتی : ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ ، خوای گەورە دەفەرموێت : بەندەکەم ستایشی کردم ، وە ئەگەر وتی : ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾ ، خوای گەورە دەفەرموێت : بەندەکەم بە گەورە ڕای گرتم ، وە ئەگەر وتی : ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴾ ، خوای گەورە دەفەرموێت : ئەمە لە نێوان من و بەندەکەمدایە وە بۆ بەندەکەم هەیە ئەوەی کە داوای دەکات .

﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ ﴾ ئەمە بۆ خوایە ، ﴿وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴾ ئەمە بۆ بەندەیە ، لە فەرمایشتی ﴿وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴾ەوە تاوەکو کۆتایی سورەتەکە بۆ بەندەیە چونکە بەندە پێی دەپاڕێتەوە لە پەروەردگاری ، وە لە ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ەوە تاوەکو ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ ﴾ ئەمە بۆ خوای پاكوبێگەرد و پایەدارە چونکە هەمووی ستایشە لەسەر خوای گەورە ، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر گەورەیی ئەم سورەتە بۆیە فەرموویەتی : ((فَإِذَا قَالَ : ﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ٧ ﴾ ، قَالَ : هَذَا لِعَبْدِي وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ))[١٣].

---

(١٣) أخرجه مسلم من حديث أبي هريرة : كتاب الصلاة ، باب (١٠) ، رقم : (٣٩٥) ، [٢ / ٣٢٤] .

واتــه : وه ئه‌گـه‌ر وتـى : ﴿ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ﴿٦﴾ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ ﴿٧﴾ ﴾ ده‌فـــه‌رموێت : ئه‌مـــه بـــۆ به‌نده‌كه‌مه وه بۆ به‌نده‌كه‌میش هه‌یه ئه‌وه‌ی كه داوای ده‌كات .

**٨ ـ ئه‌و سوودانه‌ی كه لێی ده‌رده‌هێنرێن :**

وه به‌شێك له‌وه‌ی كه په‌یوه‌سته به‌م سوره‌ته‌وه و به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر گه‌وره‌یه‌تی‌یه‌كه‌ی ئه‌وه‌یه كه زانایان ره‌حمه‌تی خوایان لێبێت فه‌رموویانه : به‌ڕاستی ئه‌م سوره‌ته چه‌ندین واتای گه‌وره‌ی تێدایه ، له‌وانه‌ش :

**یه‌كه‌م** : سه‌لماندنی هه‌ر سێ جۆره‌كه‌ی یه‌كخواپه‌رستی :

فه‌رمایـشتی ﴿ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾ ئه‌مـه به‌ڵگه‌یـه بـۆ یه‌كتاكردنه‌وه‌ی خوا له په‌روه‌ردگارێتیدا (توحيـد الربوبيـة) ، وه فه‌رمایـشتی ﴿ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ﴿٤﴾ ﴾ ئه‌مـه‌ش به‌ڵگه‌یـه له‌سه‌ر یه‌كتاكردنه‌وه‌ی خوا له ناو و سیفه‌ته‌كانیدا (توحيـد الأسمـاء والـصفات) ، وه فه‌رمایـشتی ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾ ئه‌مـه‌ش به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر یه‌كتاكردنه‌وه‌ی خوا له په‌رستندا توحيد الألوهيـة) ، كه‌واته هه‌ر سێ جۆره‌كه‌ی یه‌كخواپه‌رستی تێدایه .

**دووه‌م** : ناردنی په‌یامی خوا و پێغه‌مبه‌رایه‌تی ده‌سه‌لمێنێت :

چونكه فه‌رمایشتی ﴿ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾ سه‌لماندنی په‌روه‌ردگارێتی خـوای تێدایـه بـۆ هـه‌موو دورسـتكراوه‌كانی ، وه لـه داخوازییـه‌كانی

پەروەردگاریتی خواش ئەوەیە کە وازنەهێنێت لە بەندەکانی بە بێ بەرنامەیەك کە ژیانیان چاك بکات ، وە لە گەورەترین ئەو شتانەی کە بەندەکان چاك دەکات ناردنی پێغەمبەرانە ، هەروەها فەرمایشتی ﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴾ چونکە ڕێگای ڕاست روون نابێتەوە تەنها بە ناردنی پێغەمبەران نەبێت (عليهم الصلاة والسلام) ، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر سەلماندنی پەیامە خوایەکان .

**سێیەم** : وەڵام و بەرپەرچدانەوەی تێدایە بۆ گرووپە گومڕابووەکان :

ـ بەرپەرچدانەوەی بێباوەڕەکان و پەکخەرەکان (الملاحدة والمعطلة) تێدایە ئەوانەی باوەڕەیان بە هیچ پەروەردگارێك نییە ، جا فەرمایشتی ﴿ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ وەڵامە بۆ بێباوەڕەکان ئەوانەی کە پێیان وایە جیهان پەروەردگارێکی نییە ، بەڵکو پێیان وایە جیهان خۆی خۆیی بە دیهێناوە ! ! وە سروشت ئەم شتانە بەدی دێنێت و دروستیان دەکات ! ! وە ئەمەش پێچەوانەی عەقڵ و ژیرییەکانە ، چونکە هەرگیز ناکرێت و نابێت دورستکراوێك هەبێت بە بێ دوورستکار ، وە کردەوەیەك هەبێت بە بێ بکەر .

ئەم هەمووگەردوونە و ئەم دورستکراوانەش بەڵگەن لەسەر خوای دورستکاری پاكوبێگەرد و پایەدار ، وە هەر ئەویشە بەدیهێناوە و کاروبارەکانی بەڕێوە دەبات .

ـ وە وەڵام و بەرپەرچدانەوەشـی تێدایـە بـۆ هاوبـەش بـۆ خـوا بڕیاردەرەکان (الـمشركون) ئـەوانەی کـە بـاوەڕیان بـە پەروەردگـار هەیـە بـەڵام هاوبەشی بۆ بڕیاردەدەن لـە پەرەسـتنیدا ، ئەمـەش لـە فەرمایـشتی ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ و فەرمایـشتی ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾دا هەیـە ، ئەمـە هـەمووی وەڵام و بەرپەرچدانەوەی تێدایـە بـۆ هاوبـەش بڕیاردەرەکـان ئەوانـەی کـە خـوا دەپەرەسـتن و لەگەڵیدا جگە خواش دەپەرەستن .

ـ وە هـەروەها وەڵام و بەرپەرچدانەوەشـی تێدایـە بـۆ جەهمیـە و موعتەزیلە و ئەوانەی ئینکاری سیفەتەکانی خـوا دەکـەن ، وە وەڵام و بەرپەرچدانەوەشـی تێدایـە بـۆ ئەوانـەش کـە ئینکـاری زیندووبوونـەوە دەکـەن ئەمـەش لـە فەرمایـشتی ﴿ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴾دا هەیـە ، وە ﴿ ٱلدِّينِ ﴾ لێـرەدا واتـای پاداشـت و لێپرسـینەوە دەدات ، کـە زیندووبوونەوە دەسەلمێنێت .

ـ وە وەڵام و بەرپەرچدانەوەشی تێدایە بۆ جوولەکـە و گاورەکـان و ئەوانـەش کـە لەسـەر ڕێگـای ئـەوان دەڕۆن ئەوانـەی کـە زانـستیان وەرگرتـووە و وازیانهێنـاوە لـە کـردەوە کـردن ، یـان کردەوەیـان وەرگرتووە و وازیانهێناوە لـە زانـست ، جـا وەڵامـی تێدایـە بـۆ هـەموو زانایەك کە کردەوە بە زانستەکەی نەکات ، وە وەڵامی تێدایە بۆ هەموو کردەوکارێـك کـە بـە بـێ زانـست کـردەوە بکـات ، لەبـەر ئەمـە زانایـان

فەرموویانە : ئەم سورەتە وەڵام و بەرپەرچدانەوەی هەموو دەستە و گرووپەکانی لە خۆگرتووە ، جا بۆیە شایستەی ئەوەیە بە بنەمای قورئان (أُمُّ الكتاب) ناو بنرێت ، چونکە بنەمای هەر شتێك ئەوەیە کە ئەو شتە دەگرێتەوە بۆ لای ، وە قورئان هەمووی دەگرێتەوە بۆ سەر ئەم سورەتە ، چونکە هەموو قورئان لە دەوروبەری ئەم واتایانەدا دەسوڕێتەوە کە ئەم سورەتەی لە خۆیی گرتووە .

وە ئەم سورەتە گەورەیە زۆرێك لە خەڵکی دەیخوێننەوە و بە زومانیان دووبارەی دەکەنەوە بەڵام بیرناکەنەوە لە ماناکەی و هیچ لە ماناکەی تێناگەن ، بەڵکو تەنها چەند وتەیەکە بەسەر زمانیدا دێت هەروەکو ئەوەی وتەیەکی بیانی بێت!! وە ئەمەیش هەڵە و ناتەواوییەکی گەورەیە ، وە قورئان بۆ ئەوە دابەزێنراوە کە بیری لێبکرێتەوە و لە ماناکانی تێبگەیت ، ئەمە و خواش زاناترە .

وَصَلَّى اللهُ عَلَى نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِـهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّم

الْحَمْدُ للهِ الذِّي وَفَّقَنِي لِتَرْجَمَةِ
هَذِهِ الرِّسَالَةِ الصَّغِيْرَةِ الْحَجْمِ الْعَظِيْمَةِ النَّفْعِ وَالْفَائِدَةِ
(لَقَدْ بَدَأْتُ بِتَرْجَمَتِهَا مِنْ بَلْدَتِي كَلار ، وَانْتَهَيْتُ مِنْهَا فِي مَكَّةَ الْمُكَرَّمَةِ
أَثْنَاءَ مَوْسِمِ عُمْرَةِ رَبِيْعِ عَامِ ١٤٣٤ مِنَ الْهِجْرَةِ النَّبَوِيَّةِ)

مَكَّةَ الْمُكَرَّمَةِ / شَارِعِ أَجْيَاد / فُنْدُق أَوْتَادِ مَكَّة / بِالْقُرْبِ مِنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَام
بَعْدَ مُنْتَصَفِ لَيْلَةِ الْخَمِيْس / ٩ / جَمَادِي الأُوْلَى / ١٤٣٤ هـ
اللَّهُمَّ ارْزُقْنِي الاتْيَانَ إِلَى الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ مَرَّاتٍ عَدِيْدَة
وَارْزُقْنِي الإِقَامَةَ فِي مَكَّةَ الْمُكَرَّمَةِ وَالْمَدِيْنَةِ النَّبَوِيَّة
ـ قُولُوا : آمِيْن ـ

وَقَبْلَهَا وَفَّقَنِي اللهُ لِتَرْجَمَةِ رِسَالَةِ
(الدُّرُوسُ الْـمُهِمَّةُ لِعَامَّـةِ الأُمَّـةِ)
لِسَمَاحَةِ الشَّيْخِ عَبْدِالعَزِيْزِ بْنِ بَاز رَحِمَهُ اللَّهُ
أَثْنَاءَ مَوْسِمِ حَجِّ عَامِ ١٤٣٣ مِنَ الْهِجْرَةِ النَّبَوِيَّة

أبو فردوس محمد بن عبدالرحمن الكردي العراقي